منتدى إقرأ الثقافي

# ئەیدز

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## لە ١٠ خولەکدا

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

ئامادەکردنی
د. خالص قادر احمد
بەڕێوەبەری ڕاگەیاندن




لەبڵاوکراوەکانی پرۆگرامی
ئەیدز لەکوردستان
٢٠١١

# ئەیدز
# لە ١٠ خولەکدا


ئامادەکردنی

د. خالص قادر احمد

بەڕێوەبەری ڕاگەیاندن


تایبەتە بە بەڕێزان :

- مامۆستایانی کوردستان
- چالاکوانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی لەکوردستان
- ڕاگەیاندکاران لەکوردستان

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : ئەیدز لە (١٠) خولەکدا

نووسین و ئامادەکردنی : د. خالص قادر ئەحمەد

پێداچوونەوە : ئەنجومەنی باڵای ئەیدز لەهەرێمی کوردستان

نەخشەسازی و بەرگ : زانـــا احمد کـەریـم

چـــــــــــاپ : چاپخانەی پـــاك

تیـــــــــــراژ : (١٠٠٠٠) دانە

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

# مەترسیەکانی ئایدز

مەترسییەکانی ئایدز ئەوەندە ترسناکن، تا کار گەیشتۆتە ئەوەی هەموو ولاتانی دونیا بەپێی ئیمکانیاتی ماددی و ئاستی وشیاریان سەرقاڵی دۆزینەوەی رێگە چارەکان و کەمکردنەوی مەترسییەکانن، چونکە ئێستا بێجگە لەوەی بکوژێکی راستەوخۆیە بەسەر کەسی تووشبوو، لەهەمان کاتدا هەزاران کەسی بێ گوناهیشی قوت داوە، لەهەمووی دڵ تەزێنتر ئەو مندالانەن کەلە رێگای دایك و باوکیانەوە یان خوێنەرە یان هەر هۆکارێکی دیکە دەبنە قوربانی، بۆیە دوای ئەوەی ئایدز لەوە تێپەریوە کە تەنها نەخۆشی ڤایرۆسێك بێت، بەڵکو بووەتە دیاردەیەکی پزیشکی نێو دەوڵەتی..

جێگەی دەستخۆشیە وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان ماوەیەکی دەستی کردووە بەهەڵمەتێکی وشیارکردنەوە، ئەم کارە ئەگەر بۆ هەموو خەڵك جێگەی گرنگی پێدان بێت، بۆ ئێمەی زانایانی ئایینی پترە..

چونکە بەرەنگاربوونەوەی ئایدز لەدیدی ئێمەدا جگە لە ئەرکە مرۆییەکەی واجبێکی دینیشە، چونکە دەچێتە خانەی خۆ

بەکوشتدان... بۆیە لەرێگەی ئەو هەڵمەتەی وەزارەتی تەندروستی داوا لەمامۆستایانی ئایینی و بەتایبەتی تر وتاربێژان دەکەم هاوکارێکی دڵسۆزو غەمخۆربن بۆ وشیار کردنەوەی خەڵك و هاندان بۆ دوورکەوتنەوە لەو شتانەی دەبنە هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەو دوژمنەو هاندان بۆ پاکتری و ژیانێکی تەندروست و دەستگرتن بەرەوشتی بەرزو بڵاوکردنەوەی رۆحی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خوداو گەل و وڵات و مرۆڤایەتی دا .

بەئومێدی ژیانێکی پڕ تەندروست باشی بۆ هەمووان

**عبدالله ملاسعید گرتکی**

**سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئاینی**

**ئیسلامی کوردستان**

**٢٠١١/٦/١**

## پێشینەی مێژوویی

- ئەیدز بۆ یەکەم جار لە هاوینی ١٩٨١ لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە وولایەتی لۆس ئەنجلۆس دۆزرایەوە.
- لەساڵی ١٩٨٣ ڤایرۆسی ( HIV ) بۆ یەکەم جار لە نەخۆشێکی تووشبوو بەهەڵئاوسانی لیمفەگرێکان جیاکرایەوە.
- لەساڵی ١٩٨٤ سەلمێندرا کە ڤایرۆسی ( HIV ) هۆکاری نەخۆشی ئەیدزە.
- لەساڵی ١٩٨٥ پشکنینی ( ELISA ) ئەلایزا دۆزرایەوە کە بەهۆیەوە توانرا کەسانی هەڵگری ڤایرۆسەکە دەستنیشان بکرێن.
- لەساڵی ١٩٨٦ ر.ت.ج پرۆگرامی تایبەتی بەرەنگاربوونەوەی ئەیدزی دانا.
- لەساڵی ١٩٨٨ کۆبوونەوەی لوتکەی جیهانی وەزیرانی تەندروستی لەلەندن ١٢/١ بەرۆژی جیهانی ئەیدز ناسێندرا.
- لەساڵی ١٩٩٦ ( UNAIDS ) پرۆگرامی یەکگرتووی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەیدز پێك هات کە چەند رێکخراوێك لە خۆ دەگرێت وەك: WHO, UNDP, UNICEF, UNPF, WORLD, bank

## ئەیدز چی یە ؟

ئەیدز ئەخۆشیەکی دریژخایەن و ترسناکە ،بەهۆی ڤایرۆسی ( HIV) ەوە ڕوودەدات ، بە دواقۆناغی هەوکردنی ڤایرۆسەکە دادەنریّت کە تیایدا نەخۆشەکە کۆمەلّیك نیشانەی تایبەت و جیاکەرەوەی لیّ بەدیاردەکەویّت ،(( یاخود بە هۆی هەوکردنەکەوە ژمارەی خرۆکە سپیەکانی ( CD4 ) دەگاتە ئاستی کەمتر لە ٢٠٠خانە لە یەك ملیلترسیّ جای خویّن بەبیّ گویدان بە بوون یان نەبونی نیشانەکان )) .

ووشەی ئەیدز کورتکراوەی ووشەی ئنگلیزی ( AIDS ) ە کە لە پیتە سەرەتاکانی هەر جوار ووشە دروستکراوە Acquired Immunodeficiency Syndrom

واتە : کۆمەلّیك نیشانەی دەستکەوتوو بەهۆی کەمی بەرگری لەش .

کەواتە بە تەنها توشبوون بە هەوکردنی ڤایرۆسی HIV ئەیدز ناگەیەنیّ.

١- نيشانه باوەكانی نەخۆشی ئەیدز :

أ. بەرزبونەوەی پلەی گەرمی لەش بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك بەبی بونی هۆكارێكی زانراوی تر .

ب. سكچونی درێژخایەن بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك بەبێ بونی هۆكارێكی زانراوی تر .

ج. كەمبونی كێشی لەش زیاتر لە ١٠٪ ی كیشی ئاسایی زۆر ئارەقەكردن بە شەو

د. گەورەبونی گرێ لیمفیەكانی لەش.

ئەو نیشانانە ، دەست نیشانكەر نین بەلكو كاتێك هیچ هۆیەكی تر نەبوو بۆ ئەو نیشانانە ئنجا بە نیشانەی پەیوەندار بە ئەیدز دادەنرێن .



٢- نیشانە تایبەتیەکان یاخود جیاکەرەوەکانی نەخۆشی ئەیدز:

أ. بوونی هەوکردنی هەلپەرستی [1] وەك هەوکردنی هەلپەرستی کەروی بۆری هەناسە و سورێنچك .. وە هەوکردنی کارینی (کەرووی) سینگ لەگەڵ هەوکردنی تۆکسۆپلازمایی مێشك (toxoplasmosis).

ب. وەرەمی یاخود گرێی هەلپەرستی وەك کاپۆسیس سارکۆمە ، لیمفۆمە .... هتد





(شێرپەنجەی کاپۆسیس سارکۆما لە پێست)



(وەرەمی هەلپەرستی نێو دەم)

---

[1] مەبەست لەو میکرۆبانەیەکە لەباری تەندروستی ئاسایدا توانای دروستکردنی نەخۆشیان نیە بەلام هەرکاتێك بەرگری لەشی کەم بووە بەهەر هۆکارێك بێت ئەوا ئەو میکرۆبانە کەسەکە تووشی نەخۆشی دەکەن.

## هۆکاری نەخۆشی ئەیدز :-



ڤایرۆسیکی زۆر بچوکە بەبێ مایکرۆسکۆپی ئەلکترۆنی ناتوانرێ ببینرێت پێی دەگوترێت ( HIV ) دوای چونە ناو لەش بەرگری لەش کەمدەکاتەوە لەکاری دەخات ، کەسەکە توشی هەوکردن و شێرپەنجەی هەڵپەرستی دە کات ( نەخۆشی ئەیدز )

## مەترسی ئەیدز لەچی دایە ؟

١- زۆربەی هەرە زۆری توشبووان گە نجن ( واتە هێزی کار و توانای کۆمەڵن )

٢- تاوەکو ئێستا چارەسەری بن برکەر نیە.

٣- تاوەکو ئێستا کوتان ( ڤاکسین ) دژ بەڤایرۆسەکە نیە بۆ خۆپاراستن.

٤- سالآنە ژیان لە ( ٢ ) ملیۆن کەس دەکوژێت و زیاتر لە ( ٣ ) ملیۆن کەس تووش دەکات.

٥- جگە لەلایەنی تەندروستی زیانی گەورەی ئابووری کۆمەڵایەتی و د مروونی ژینگەیی بەجێ دەهێڵێت لەنێو کۆمەڵگا.

## باری ئێستای بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەیدز لەجیهان

- هەوکردنی ڤایرۆسی (HIV) و نەخۆشی ئەیدز پەتایەکی جیهانی یە حالەتی توشبوون لە هەموو وولاتانی جیهان تۆمارکراوە
- ئیستا ژمارەی توشبووان دە گاتە زیاتر لە (٣٣) ملیون کەس لە جیهان
- ٢ /٣ ی توشبووان لە وولاتانی ئە فریقیا دایە
- زیاتر لە سەدا پە نجای توشبووان لە رەگەزی مێینەن
- زیاتر لە ٢,٥ ملیون مندال هەڵگری ڤایرۆسەکەن
- بە گویرەی را پۆرتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری ئەیدز (UNAIDS) رۆژانە ٧٠٠٠کەس تووشی ڤایرۆسەکە دەبن
- ساڵانە ژمارەی تووشبوان نزیکەی ٢ ملیون کەسە

- ژمارەی مردووان ساڵانە زیاتر لە ٢ ملیون کەسە
- لە عێراق بە گوێرەی دوا ئاماری وەزارەتی تەندروستی عیراقی ناوەندی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەیدز لە ماوەی نێوان ( ١٩٨٦_٢٠٠٧ ) ژمارەی توشبووان بە ڤایرۆسی ( HIV ) ٢٦٥ کەسە
- لە هەرێمی کوردستان لە سالی ١٩٨٦ تا کۆتایی ٢٠١٠ ، ( ٨٧ ) حالەت تۆمارکراووە کە ( ٦٩ ) بیانی بوون و ڕەوانەی وولآتانی خۆیان کراونەتەوە و ( ١٨ ) یان هاووڵاتی هەرێمی کوردستانن و ئێستا ( ١٤ ) کەسیان لە هەرێمی کوردستان دەژین .



## ڕێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە :

١) کاری سێکسی نادڵنیا لەگەڵ کەسی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە*

٢) دەرزی و سر نجی پیس بوو بەڤایرۆسەکە

٣) خوین و پێکهاتەکانی ئەگەر پیسبووبێ بەڤایرۆسەکە .

٤) لەدایکەوە بۆ کۆرپە ( ئەگەر دایکەکە تووشی ( HIV ) بوو بێت )









* سێکسی نادڵنیا مەبەست لەئەنجامدانی کارێکی سێکسیە لەدەرەوەی ژیانی هاوسەری (زیناکردن) وەبەبێ بەکارهێنانی کۆندۆم لەگەڵ کەسێک کەهەڵگری ڤایرۆسی کەمو کوڕی بەرگری لەشی ئەیدز بێت .

## کاری سێکسی نا دڵنیا لەگەڵ کەسی توشبوو بەڤایرۆسەکە :

گواستنەوە لە ڕێگەی کاری سێکسی ڕێگەیەکی سەرەکی گواستنەوەکەیە بەڕێژەی ٧٠٪ _ ٨٠٪ ی گواستنەوە .
چونکەلەکەسی تووشبوو ڤایرۆسەکە لە ناو شلەی تۆواو ( مەنی ) پیاو و دەردراوەکانی زێی ژن دا هەیە ، ئەوا هەموو جۆر و شێوازەکانی سێکس ئەگەری گواستنەوەی ڤایرۆسەکەی هەیە لەکەسی تووشبوو بۆ کەسی بەرامبەر .



## ئەو هۆکارانەی ئەگەری گواستنەوەی ڤایروسەکە زیاد دەکەن لە ڕێگەی سێکسەوە

١) بوونی هەوکردن لە کۆئەندامی زاوزێ یاخود ئەخۆشییە زایندەکان بەتایبەتی بونی برین ( قرحە )

٢) زۆری و کەمی ژمارەی ڤایرۆسەکە لە خوێن

٣) ژمارەی ئەو کەسانەی کە کاری سێکسی لە گەڵ ئەنجامدەدات تا ژمارەی کە سەکان زیاتر بێت ئەگەری توشبوون زۆر زیاتر دە بێت .

٤) خەتەنە نە کردنی پیاو : بە پێ لێکولینەوە کان دەرکەوتووە کە ئەو پیاوانەی خەتەنە نەکراون ئەگەری تووشبونی ڤایرۆسەکەیان زیاترە لە کاری سێکسی لە چاو ئەوانەی کە خەتەنە کراون .

٥) بەکار نەهێنانی کاندۆم

٦) لە کاتی بێنوێژی ئەگەری توشبوون زیاترە .

## کواستنەوەی خوین و پیکهاتەکانی ئەکەر پیس بوو بیت بەڤایروسەکە



ڤایرۆسەکە لە کەسی توشبووەوە بۆ کەسێکە تر دەگوازرێتەوە بە ڕێگەی وەرگرتنی خوێن و پێکهاتەکانی تری خوێن . ڕێژەی گواستنەوە بەم ڕێگایە( ٪٥ - ٪١٠ ) ٥ .

بەکارهێنانی دەرزی و سرنج بەتایبەتی لە کەسانی ئاڵودە بە مادە هۆشبەرەکان کە چەندین کەس وە چەندان جار هەمان سرنج و دەرزی بەکار دەهێنن .

لەم حالەتانەدا تەنها لەڕێگەی خوین هێنەرەوە ناگوازرێتەوە بەڵکو لە ڕێگەی دەرزی ژێر پێست و سمت یشەوە دەگوازرێتەوە هەرچەندە ئەگەرەکە کەمترە .

لە کەسانی ئالوودە بە مادە هۆشبەرەکان ئەگەری توشبوون زیاتر دەبێت لە حالەتانەی خوارەوە :-

١) ماوەی بەکارهێنانی مادەی بێ هۆشکەر تا ماوەکە زیاتر بێت ئەگەرەکە زیاتر دە بێت .

٢) چەندجارەی بە کارهێنانی هەمان دەرزی و سرنج .

٣) ژمارەی ئەو کەسانەی بەژدارن لە هەمان دەرزی و سرنج ، تا ژمارەیان زیاتر بێت ئەگەرەکە زیاتر دەبێت .



## گواستنەوە لە دایکەوە بۆ کۆرپە :

ڤایرۆسەکە دەکرێ لە دایکێکی هەڵگری ڤایرۆسەکە ( HIV ) بۆ کۆرپەکەی بگوازرێتەوە لە کاتی سکپڕی ، منداڵبوون یان دوای لە دایک بوون بە ڕێگای شیردان بەلام زۆرترین حالەتەکان لەکاتی منداڵبوون و ماوەیەکی کورت بەر لە منداڵ بوون ڕوودەدەن .



ئەگەری گواستنەوەکەش لە دایك بۆ کۆرپە کەمدەبێتەوە بە بەکارهێنانی دەرمان لەکاتی سك پڕی و منداڵ بوون وە هەروها دوای منداڵ بوون بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆرپە .

ڕێژەی گواستنەوە لە دایك بۆ کۆرپە لە ١٥٪ تاوەکو ٢٥٪ بەلام لە وولاتە تازە پێگەیشتووەکان ڕێژەکە زیاترە ( ٢٥٪ تا ٣٥٪ ).

## ئایا ڤایرۆسەکە بەرێگەی شلەکانی تری لەش دەگوازرێتەوە؟

هەرچەندە ڤایرۆسەکە لەهەموو شلەکاتی لەشی کەسی تووشبوو بەڤایرۆسەکەدا هەیە بەلاّم تائێستا دەرنەکەوتووە کەئەو شلانەی خوارەوە ببنە هۆی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە.

١ لیکی دەم :

لیکی دەم ژمارەیەکی کەمی لە ڤایرۆسەکە تیّدایە بەلام تا ئیستا دەرنەکەوتووە کە لەرێگەی لیکی دەمەوە بگوازرێتەوە وەك ماچکردن (ڤایرۆسەکە نا گوازرێتەوە ) وە هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بونی جۆرە پرۆتینێکی دژە فایرۆسەکە لەناو لیکی دەم .
بەرێگەی گەستنی مرۆڤ ڤایرۆسەکە دەگوازرێتەوە بەلام زۆر دەگمەنە .

٢ فرمێسك . ئارەقە . میز :

ئەو شلانەش ڤایرۆسەکەیان تیّدایە بەلام هۆکاری گواستنەوە نین ( تا ئیستا نە سەلمێندراوە ).

## ڤایرۆسی ( HIV ) بەم ڕێگایانە ناگوازرێتەوە

١. پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئاسایی : وەك

تەوقە کردن ،لە باوەش گرتن ، ماچ کردن، هەڵسوکەوتی ڕۆژانە لەگەڵ نەخۆش ، خواردن و خواردنەوە لەگەڵ کەسی توشبوو .

٢. بەژداربوون لە بەکارهێنانی شوێنەگشتی یەکان : وەك

دەست شۆر ، ئاودەست ، گەرماو ، مەلەوانگە، تەلەفۆنی گشتی ...

٣. لە ڕێگەی مێش و مەگەز

٤. لە ڕێگەی هەناسە و پژمینەوە

٥. لە ڕێگەی دەم : وەك خواردن و خواردنەوە

٦. بەکارهێنانی جل و بەرگی بەکارهاتوو .

## ئایا ئەو ڕەفتارە مەترسیدارانە چین کە ئەگەری تووشبوون بەڤایرۆسەکە زیاتر دەکەن؟

- ✓ ئەنجامدانی کاری سێکسی هاوڕەگەز ( نێربازی ).
- ✓ بوونی هاوبەشی سێکسی زۆر ( وەك لەش فرۆشەکان )
- ✓ کەسانی ئالوودە بە ماددە هۆشبەرەکان
- ✓ هەروەها وەرگرتنی خوێن بەبەردەوامی ئەگەری تووشبوون بەڤایرۆسەکە زیاد دەکات وەك ئەخۆشەکانی تالاسیما و هیمۆفیلیا

## ئەخۆشی زانی ڤایرۆسی (HIV):

گرنگترین کاریگەری ڤایرۆسەکە لەسەر مرۆڤ بریتییە لە کەمکردنەوە و لە کارخستنی ئەرکی کۆئەندامی بەرگری لەش لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی یەوە لەڕێگەی کەمکردنەوەی ژمارە و لەکارخستنی خرۆکە سپی یەکانی ( T-lymphocyte ) کە پێ یان دەگوترێت خانەی یاریدەدەر ( ئەرکی ئەو خانانە

بریتیه له ناسینەوە ی هەر تەنێکی نامۆ کـه دێتـه نـاو لـەش ، پاشان یەکگرتن لەگەلێ و له ناوبردنی ) .

بەم جۆرە هاوکات لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی ڤایرۆسەکە له لـەش ژمارەی خرۆکه سپیەکانیش کەم دەبێتەوە و بەمەش بەرگری ووردە ووردە کـەم دەبێتـەوە و لـەکار دەکـەوێت وە نـەخۆش دووچـاری جۆرەها میکرۆب و وەرەمـی هەڵپەرسـتی دەبێتـەوە لـە ئـە نجام کۆمەلێك نیشانەی کلینیکی له نەخۆش بەدیاردەکەوێت و لـە دوا قۆناغیش دا نەخۆشی ئەیدز سەرهەڵدەدات .



# خـــۆپـــارێـــزی

## گرنگترین رێگە بۆ خۆپاراستن بریتیە لە هۆشیاری

مەبەست لـــە هۆشـــیاری واتـــە دەســـتکەوتنی زانیـــاری دەربـــارەی ڤایرۆسەکە و چـۆنیەتی گواستنەوە ، خۆپاراســتن و پاراســتنی کۆمــەڵ، چـــۆنیەتی مامەڵـــەکردن لەگـــەڵ کەســـی توشـــبووبە ڤایرۆســـەکە یـــاخود چـــۆنیەتی رەفتارکردنمـــان لـــە کـــاتی توشبوونمان بە ڤایرۆسەکە .

بەهێزترین چەکی رووبەروبونەوەی ئەیدز هۆشیاری یە دەربارەی نە خۆشیەکە .



**خۆپارێزی لە تووشبوون لەڕێگەی کاری سێکسی :**

١. **دوورکەوتنەوە لە کاری سێکسی لە دەرەوەی ژیانی هاوسەری ( زینا کردن ) وەك خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿ ولاتقربوا الزنى انه كان فاحشة وساء سبيلا﴾.

٢. **بەکارهێنانی کۆندۆم لەکاتی ئە نجامدانی کاری سێکسی.**

٣. **زوو چارەسەر وەرگرتن بۆ نەخۆشیە زایندەگیەکان وەك سیفلس و گۆنۆریا ....**

٤. **دورکەوتنەوە لە کاری سیکسی لە گەل ئەو کەسانەی کە پەیوەندی سیکسی فراوانیان هەیە ، یان ئالودەی مادە هۆشبەرە کانن .**



## خۆپارێزی لەتوشبوون لەرێگەی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر:

١. وازهێنان لە دەرمان
٢. بەکار نەهێنانی دەرزی و سرنجی کەسانی تر .



## خۆپارێزی لەتوشبوون لەرێگەی خوێنەوە :

١. پشکنینی خوین و پێکهاتەکانی بەر لە گواستنەوەی بۆ کەسێکی تر .
٢. دوورکەوتنەوە لە گواستنەوەی خوین تەنها لە کاتی زۆر پێویست نەبێت ( ئەویش دوای پشکنین و دڵنیابوون لە خاوێنی )
٣. پشکنینی خوین بەخشەکان بۆ دڵنیابوون لە خاوینیان لە نەخۆشیەکە .

## پێشگرتن لەگواستنەوەی ڤایرۆسەکە لەدایکی توشبوو بۆ کۆرپە:

١. پشکنینی هەموو دایکیك لە کاتی سکپری ( بۆ زانینی بوون یان نە بوونی نەخۆشیەکە )
٢. وەرگرتنی دەرمانی دژە ڤایرۆسەکە لە کاتی سکپری .
٣. زیادکردنی سەردانی بنکەی تایبەتی چاودیری دایکان.
٤. ئە نجامدانی نەشتەرگەری بۆ مندالْ بوون ئەگەری گواستنەوە کەمدەکاتەوە لە کاتی مندال بوون .
٥. ئاگاداربوون و چاککردنی خۆراکی دایك .
٦. بەکارهێنانی دەرمانی دژە ڤایرۆسەکە بۆ مندال دوای لە دایك بوونی
٧. بەکارنەهێنانی شیری دایکی توشبوو . ( رێژەی گواستنەوە لە رێگەی شیری دایك ٥ – ١٥ ٪ ) .

## دەست نیشان کردنی ڤایرۆسی (HIV)

بۆ دەست نیشانکردنی ڤایرۆسەکە تەنها بەنە نجامدانی پشکنین دەتوانین بزانین کە تووشی ڤایرۆسەکە بووین یان نا چونکە تووشبوون بەڤایرۆسەکە هیچ نیشانەیەکی تایبەتی نیە بۆ ناسینەوەی .

دەست نیشان کردنی ڤایرۆسەکە بە دوو قۆناغ دەبێت؛

١- **پشکنینی ئلیزا** : ئەگەر نەگەتیف ( - ) بوو ئەوا تۆمار دەکرێت بە نەگەتیف بەلام ئەگەر پۆزەتیف بوو ئەوا پشکنین دووبارە دە کرێتەوە بۆ دلنیا بوون ، ئەگەر نێگەتیف بوو ئە وا دادەنرێت بە نەگەتیف بەلام ئەگەر هەر پۆزەتیف بوو ئەوا دە چینە قۆناغی دووەم .

٢- **پشکنینی چەسپێنەر** ( westrn blot ) : ئەگەر پشکنینەکە نەگەتیف بوو ئەوا تۆمار دەکرێت بە نێگەتیف بەلام ئەگەر پۆزەتیف بوو ئە وا بە پۆزەتیف دادەنرێت

## چارەسەری نەخۆشی ئەیدز

بەداخەوە دەرمانی چارەسەر (بنبڕکەر) نیە بۆ نەخۆشی ئەیدز، بەڵام کۆمەڵێك دەرمانی کاریگەر هەن کەبەبەکارهێنانیان دەتوانن لەماوەیەکی کەمدا ژمارەی ڤایرۆسەکە لەلەشی کەسی تووشبوو کەم بکەنەوە بەرگری لەشی کەسە کەش بەهێز بکەنەوە بەمەش نەخۆشەکە دەتوانێت ماوەیەکی درێژتر بەتەندروستیەکی باشترو دوور لەنەخۆشیە هەلپەرستیەکان ژیان بەسەر ببات،



## چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لە کەل کەسی توشبوو بە ئەیدز

ئاشکرایە ڤایرۆسی ( HIV ) و نەخۆشی ئەیدز بە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی رۆژانە و ئاسایی ناگوازرێتەوە و کەسی توشبوو مەترسی گواستنەوەی ڤایرۆسەکەی نیە لە مامەڵەکردنی ئاسایی رۆژانە و بەیەکەوە کارکردن و گفتوگۆکردن و دانیشتن و خواردن بەیەکەوە .

هەڵسووکەوتی ئاسایی تۆ لەگەڵی پاڵپشتیەکی زۆر گرنگە بۆ



کەسی توشبوو تاوەکو ڕشت تر بێت لەسەر پاپەندبوون بە ڕێنمایی یەکانی خۆپارێزی و وەرگرتنی چارەسەر تاوەکو نەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی زیاتری نەخۆشی یەکە .

هەروەها مامەڵەکردنی ئاسایی مان لەگەڵ کەسی تووشبوو بەڤایرۆسەکە هاندەردەبێت بۆ ئەوەی کەسانی تریش پشکنین بۆ خۆیان ئەنجام بدەن و باری تەندروستی خۆیان بزانن لەلایەنی توشبوو یان توشنەبوو بەڤایرۆسەکە چونکە نەزانینی ئەو بارە زۆرجار هۆکاری سەرەکی بڵاوبونەوەی نەخۆشی یەکەیە لەکەسی توشبوو بۆ کەسانی تر .

وەك زاندراوە بەتەنها کاری سێکسی هۆکاری تووشبوون نیە بەو نەخۆشیە بەلکو ژمارەیەکی زۆر لە توشبوانی ڤایرۆسە کە بە هۆی نەزانینەوە توشی هاتوون یان بە هۆی وەرگرتنی خوینی پیس بوو بە ڤایرۆسەکە (بە هۆی نەپشکنینی خوین بەر لە گواستنەوە یاخود لەکاتی تەنگەتاوی بە بی پشکنین خوین وەرگیراوە یاخود لە کاتی پشکنین ڤایرۆسەکە دەرنەکەوتووە..) یاخود لە ئەنجامی نەشتەرگەریەکی بچوك یان کردارێکی پزیشکی ددان تووشی هاتوون.

گرنگە بیزانین  کەوا هەڵگری ڤایرۆسەکە یاخود نەخۆشی نەیدز پێویستی بە هاوکاری و سۆز و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی زیاتر هەیە، ئەوان کەسانێکن نەخۆشی یەکی درێژ خایەن و مەترسیداریان هەیە لە بارێکی دەروونی و جەستەیی خراپ دا دەژین ،بۆیە هاوکاری کردنیان ئەرکێکی مرۆیی پیرۆزە.



# بەیەکەوە
# بیرکردنەوەی ئەرێیی و کرداری ئەرێیی
# بۆ پێشگیری لەبڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەیدز



## سەرچاوە:


- پەرتووکی تێکستی پزیشکی هەناو

Harrisons principleof internal medicine

- پەرتووکی تێکستی پزیشکی هەناو

Davidsons principles and practice of medicine

- سایتی www. unaids.com
- سایتی ئەلیکترۆنی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی

www.worldhealthorganization


تووش بوو بە
ڤایرۆسی HIV
دروست بوونی
دژە تەن
زۆر بوونی
ڤایرۆس و لەکار
خستنی بەرگری
ئەیدز
مردن
کاری سێکسی
خوێن/سرنجی پیسبوو
لەدایک بۆ کۆرپە
٢ - ١٢
هەفتە
٦ مانگ
تاوەکو ١٠ساڵ
یان زیاتر
٦ مانگ نزیکەی ٢ ساڵ
هەڵگری ڤایرۆسەکە هیچ نیشانەیەکی
نەخۆشییەکەی لێ دەرناکەوێت
هەوکردن و شێرپەنجەی
هەڵپەرستی

